## ناسنامەی کتێب

ناوی کتێب : نـــەخۆشـــی دڵان

نووسینی : عمرعبدالکافی

وەرگێرانی : عبدالجلیل علی

پێداچوونەوە : م/ مەلافەتحی زراری

کاری کۆمپیوتەر : زیلان

بەرگ : عەکاف احمد زراری

چاپ : یەکەم/هەولێر/٢٠٠٧

تیراژ : (١٠٠٠) دانە

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (٧٧٩) ساڵی ٢٠٠٧ پێ دراوە




بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

سوپاس وستایش بۆ ئەو خوایەی کە قورئانی بۆ سەر بەندەکەی خۆی دابەزاندوە وهیچ نارێکیەکی تێ نەکردووە، پاکی وبێ گەردی هەر بۆ ئەوە، کە سوورە لەسەر فەرز کردنی پەیامەکەی.

﴿ وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ وَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ ال عمران/١٠٤.

واتە: پێویستە لە ئێوە ئومەتێك پێك بێت یان با هەمووتان ئومەتێك بن کە بانگخوازی بکەن بۆ چاکە و فەرمان بکەن بە

هەموو كارێكی باو ودروست وقەدەغەی هەموو نادروستیەكان بكەن، ئا ئەوانە سەر فرازن. ((ت. ئاسان)).

شایەدی دەدەم كە ﷲ تاكە وهیچ هاوەڵی نیە وشایەدی داناوە وتەواوی كردووە وڕاستە ڕێی داناوە:

﴿ وَيَأْبَى اللَّهُ إِلاَّ أَن يُتِمَّ نُورَهُ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ ﴾التوبة/٣٢.

واتە: خوا ناهێڵێت ئاواتیان بێتە دی هیچی تری ناوێت جگە لەوە نەبێت ئایین ونوری خۆی سەر بخات وتەواوی بكات ودیاری بخات هەر چەندە كافر وگاورەكان پێی سەغلەت ودڵتەنگ دەبن. ((ت. ئاسان)).

وشایەدی دەدم كە سەروەر وخۆشەویستمان محەمەد ع نێردراوی خوایە: پەیامەكەی گەیاندوە وڕاسپاردەكەی گەیاندوتە جێ وئامۆژگاری خەلكی كردووە وتەم ومژی لاداوە وهەتا ڕۆژی كۆچی دوایی تێ كۆشایە بۆخوا

بەڕاستی، خوایە گیان تۆ درود وسەلاواتی لەسەری بدە ولەگەڵ کەس وکاری ویاوەران وهاوسەرەکانی و شوێنکەوتوەکانی کە بڕوایان پێ هێناوە، بڕوایان بەستەم نەپۆشیوە وبەڕاستی ئەوان دڵنەوایی ورێگای هیدایەتیان هەبوو.

**ئیدی:**

ئەی برایانی موسڵمان: ئەگەر مرۆڤ نەخۆش کەوت ودانی نا بەوەی کە نەخۆشە ئەوە نزیکەی نیوەی چارەسەرەکەیە جا ئەگەر چووە لای نوشدار وباوەڕی پێ هێنا ورێنماییەکانی وەرگرت ودەرمانەکانی بەکار هێنا ئەوە بە ئیزنی خوا چارەسەری دەبێ.

وەلێ ئەگەر نەخۆش بێ وبڵێ من هیچ نەخۆش نیمە هەر بەدوای جوانی لاشەو وەرزش بکەوێ ووابزانێ کەوا خۆی پاڵەوانی زۆرنبازێیە و سەرەڕای ئەوەش کەتووشی دەردێکی کوشندە بوو، بەلاّم دانەنێ وبەدوای چارەسەر دا نەگەڕێت، ئەو کاتە ئومێدی چاك بوونەوە بۆ نەخۆشیەکەی ئەستەمە.

جا دڵێش نەخۆش ودەردەدار دەبن، جا من لە نەخۆشی دڵ مەبەستم تەسك بوونەوەی خوێنبەرەکان ولێ دانی دڵە خورپە ودڵتەنگی ئاسای نیە یان... من باسی لایەنی پزیشکی وشیکردنەوە ناکەم، بەڵکو ئەوە لە پسپۆڕی تەندروستی دایە، وەلێ من باسی دەردی دڵان دەکەم لە ڕووی باوەڕ وئیمانەوە.

تۆ پێوانەیەکت دەوێ بۆ ئەوەی بزانی داخۆ دڵەکەت نەخۆشە یان ناساغە یان هەر دڵەکە مردووە لە ڕووی ئیمانەوە "خوا پەنامان بدات" ؟.

**ئایا پێوەری نەخۆشی دڵان چی یە؟**

**سەرنجی ئەم گشتیە بدە لە هەر پێنج تەوەرەکاندا:**

١- ئەگەر دیتت دڵەکەت دنیای زۆر خۆش دەوێ ودوا ڕۆژی لەبیر کردووە، ئەمە نیشانەیەکە لە نیشانەکانی نەخۆشی دڵ.

٢- ئەگەر دیتت سامان وپارەت خۆش دەوێ، ولێپێچانەوەت لەبر چووە، ئەمەش نیشانەکە لە نیشانەکانی نەخۆشی دڵ.

٣- خەلکت خۆش بوێ: وەکو هاوسەر ومالْ ومندالْ وهەر شتێك وبەدیهێنەرت لەبیر چووبوو، ئەوەش نیشانەکە لە نیشانەکانی نەخۆشی دڵ.

٤- ئەگەر کۆشك وتەلارت خۆش ویست و گۆرستانت لەبیر چووە، ئەمەش نیشانەیەکە لە نیشانەکانی نەخۆشی دڵ.

٥- ئەگەر تاوانت پێ خۆش بوو تۆبەت لەبیر چووە، ئەمەش نیشانەی پێنجەمە لەنیشانەکان، کە دڵەکەت نەخۆشە ودەردەدار بووە،خوایە سارێژی دڵە نەخۆشەکانمان بکە ئەی پەروەردگار.

برایان: بەڕاستی هاوەڵانی خۆشەویست ﷺ بۆ دوارۆژ "قیامەت" دەژیان وخۆشیان دەویست، وەلێ لەسەردەمی ئێمەدا زۆربەی خەڵك توشی نەهامەتی بوونە، ئەویش زۆربەیان تووشی یاخی بوون بوونە لە کۆڕی ئەو زانایانەی کە پەیامی یەکتاپەرستی (( لا اله الا الله، محمد رسول الله )) یان هەڵگرتووە.

جا كە دەربارەی شتێك لە زانایەك دەپرسی دەڵێ: حەرامە، بەڵام لە برادەرێك دەپرسێتەوە، دەڵێ: من لە مەلایەكی دیكەم پرسی ئەو گوتی حەڵاڵە!!

خۆ ئەگەر پێت گوت: ئەو جێی گومانە (شبهەی تێدایە) دەڵێ نا من گومانی تێدا نابینم!!

پێی دەڵێین كاكە ئەو تەلاقە كەوتووە، پێت دەڵێ: بەلام حەنەفیەكان وا نالێن، سەرەڕای ئەوەش نە شارەزای حەنەفی یەو نە هیچی لێ خوێندوە یان بێ ئەوەی لە هیچ خوێندگایەك خوێندبی.

برای موسڵمان: ئەوەی بەڕاستی دەیەوێ ڕێگای خوا بكرێ وخەلكی پێ بەختەوەر بكات، دەبێ یەكەم جار خۆی پێ بەختەوەر بكات پێش هەموو كەس خۆی لە خۆیەوە دەست پێ بكات.

جا هاوەڵان ئاخیرەتیان بە گرنگ دەزانی ودنیایان بەکەم دادەنا، ئەوجا بانگێك لە ئاسمان هات گوتی: ئەی دونیا ئەوەی خزمەتت دەکات تۆش خزمەتی بکە وکێ بەکارت دەهێنی توش بەکاری بهێنە بۆ خۆت.

دیوتە منداڵێکی گچکە یان هاوسەرەکەت یان دراوسێیەك یان برادەرێك یان شاگردێك ئامۆژگاریت وەربگرێ؟

ئەوەندەی من بزانم زۆربەی خەلکی لە حاڵەتی یاخیبووندان، خۆ ئەگەر پێی بڵێی کاکە رۆژ لە ڕۆژ هەڵات هەڵدێ پێت دەڵێ ئەوەش ناکۆکی لەسەر هەیە، چونکە دەیەوێ لاملی بکات، چونکە مل ملانی هەر لە ناو خوێنی دا هەیە، مشتومڕ لەسەر شتە نەگۆڕەکانیش دەکات، بەلاّم ئەگەر لە خۆی پێچایەوە ئەو کاتە حەز دەکات گوێ لە حەق بگرێ وگوێ لەو کەسەش بگرێ کە ڕێنمای بەرەو چاکە وخێر دەکات.

پێویستە ئامۆژگاری بچێتە ناخی دڵی بەندە پێش بانگدانی، هەموو هەینیەك نوێژ دەکات وگوێی لە ووتار خوێنان دەبێ ودەبینی خەلکی دەچنە مزگەوتەکان وگوێ دەگرن ورەوشتەکانی موسڵمانان بە چاو دەبینن، کە چۆن هەڵسووکەوت دەکەن لەگەڵ یەکدی؟ لە کاتی نوێژدا ئەگەر لە تەنیشت هەندێك کەس ڕانەوەستێ وکەمێك جێگاکەی تەنگ بکات ئەوە تورە دەبێ ورادەگا ووا دەزانێ لە زۆرانبازێ دایە، یان ئەگەر برایەك ببینێ کەمێك سستە لە پەرستشەکانی بتەوێ ئامۆژگاری بکەی زۆر جار تورەش دەبێ لێت، خۆ ئەگەر بە قسەی خۆشیش پێی بڵێی هەر لێت وەرناگرێ، بۆچی؟

چونکە هەست بە لوت بەرزیەك دەکات لەسەر زەوی "خوا سەلامەتمان بکات" بەڕاستی لوت بەرزی ئەوەیە کەوا ئامۆژگاری وەرنەگری، جا لەقیامەت یەکەم جار هەر



که لوت بەرز واته ((خۆ بەزل زان)) که خۆی له ئاگر دەبینێ، خوا دەفەرمووێت:

﴿وَنَادَى أَصْحَابُ الْجَنَّةِ أَصْحَابَ النَّارِ أَن قَدْ وَجَدْنَا مَا وَعَدَنَا رَبُّنَا حَقًّا فَهَلْ وَجَدتُّم مَّا وَعَدَ رَبُّكُمْ حَقًّا قَالُواْ نَعَمْ فَأَذَّنَ مُؤَذِّنٌ بَيْنَهُمْ أَن لَّعْنَةُ اللَّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ﴾ الاعراف/٤٤ .

**واته: جا نیشتەجێیانی بەهەشت بانگی دۆزەخ نیشینان دەکەن: بەراستی ئەو بەڵێنەی پەروەردگارمان پێی دا بووین وەدەستمان کەوت و پێی بەخشین ئایا ئێوەش بەڵێنەکەی پەروەردگارتان دابووی بەراستی دەستان کەوت، لەوەلامدا (( بەڵشکاویەوە )) گوتیان: بەڵێ، ئەوسا جارچییەك له نێوانیان دا گوتی: نەفرەتی خوا لەسەر کافران بێت. ((ت. ئاسان)).**

جا یەکەم جار لەوێ داندەنێ بەخوا، بەلآم لەدنیادا ئەگەر مامۆستایەك پێی بڵێ کاکه خوا هەیه، دەڵێ نا نا:

خوا چی؟ پێی دەڵێی گومانت هەیە لە بوونی خوا؟ دەڵێ: ئەوە گومان نیە!

**كاكە گیان :**

ئەگـەر مامۆسـتایەكت دیـت كـە بەڕاسـتی زانایـەكی دڵسۆزە بۆ خوا بە چاكی دەزانی گوێی لێ بگرە وقسەكانی لـێ وەربگـرە وئامۆژگاریـەكانی بـۆ تـۆ وبـۆ هـەمووان بەسوودە، بەچاوی دوژمنایەتی تەماشای مەكە، خۆ هیچ كێشەتان لە بەین نیە، خۆ بە ئارەزووی خۆی ولەخۆیەوە حوكم نادات، بەڵكو بە گوێرەی قورئان وسوننەت دەدوێ.

جـا ئەوەتـە بەسـەرهاتی ((حـەبیبی نـەجار)) كـە لەسورەتی یاسیندا ئەگەر بیخوێنیتـەوە خۆ زۆر كەسـیش هەر لە بەریـەتی، ئـەو شـارەی كـە خـوا دەردی خێـری لـێ كردنەوە دوو پێغەمبەری بۆ ناردن وپاشان بەسێ یـەمیش بەسەری كردنەوە، جا وەڵامی خەلكەكە چی بوو؟

هەر ئەوە بوو بەدرۆیان خستنەوە (( باوەڕیان پێ نەهێنان ))، هەروەکو زۆر جاریش لەسەردەمانی دیکەش واقەوماوە، جا لەو کاتەدا لەو پەڕی شارەکە پیاوێك بە پەلە هات، واتە بۆ چاکە وئامۆژگاری هات بۆ پشتیوانی کردنی لەو پێغەمبەرانە:

﴿ ... قَالَ يَا قَوْمِ اتَّبِعُوا الْمُرْسَلِينَ ** اتَّبِعُوا مَن لاَّ يَسْأَلُكُمْ أَجْرًا وَهُم مُّهْتَدُونَ﴾ يس/٢٠ - ٢١.

واتە: **کابرا گوتی شوێنی ئەو کەسانە بکەون کە پاداشت وکرێتان لێ داوا ناکەی، ئەوانە هیدایەت دراون لەسەر بەرنامەیەکی ڕاست ودروست. ((ت. ئاسان))**

کاکە کە تۆ نەخۆش دەکەوی دەچیتە لای نوشدار پاش پشکنین وتاقیگە پێت دەڵێ پارەکەت نەوەندە دەکات، یەکسەر پەرەکەی دەدەی وزۆر دڵخۆشیش دەبی، خۆ ئەگەر پێت بڵێ چارەسەرت لێرە نیە ولە فلانە ولاتە

یەکسەر بەدوای پاسەپۆرت دا دەچی ودەچیە ولاتێك کە توشداری باشی هەبێت، لەبەر ئەوەی لە تەندروستیت دەترسی، جا ئەگەر لەو گەشتەتدا بە هەزاران دۆلارت بچێ زۆر بە دڵرەزایی پارەکە دەدەی.

بەلاَم هەرچی زانایانی ئاینیە ئەوان بۆ چارەسەری دڵەکەت دەگەڕێن، خۆ داوای هیچت لێ نا کەت تەنها ئەوەندە: بەرفەرمانی فەرمانی خوا وخۆشەویستەکەی بکە، لەسەر ئەوەش تۆ ناتەوێ ولوت بەرزی لێ دەکەی؟ سەیرە، جا بابچینەوە سەر باسی ((یاسین)) کابراش لەو پەری شار هات وگوتی:

﴿ ... قَالَ يَا قَوْمِ اتَّبِعُوا الْمُرْسَلِينَ﴾ يس/٢٠.

واتە: **گوتی ئەی قەومەکەم بە شوێن ئەم پێغەمبەرانە بکەون وبە گوێیان بکەن.**

بەداخەوە خەلکەکە بەگوێی ئەو پیاوە ئامۆژگاری کارە ڕاستگۆیەیان نەکرد، هەر بەوەش نەوستان وخستیانە سەر زەوی وبە پێلاقان بەسەر ورگی کەوتن هەتا ریخۆلەکانی لە پاشکۆی دەرچوو، جا کە گیانی دا هێشتا هەر دڵی نەهات دوعای خراپ لە خەلکەکە بکات، چونکە دلسۆزانی پەیوەست بەخوا قەت دوعای خراپ لەکەس ناکەن بێجگە لە دوعای هیدایەت بوون وڕاستەڕێ بوون نەبێ.

جا کابرا کە گیانی دەرچوو گوتی:﴿ قَالَ يَا لَيْتَ قَوْمِي يَعْلَمُون ** بِمَا غَفَرَ لِي رَبِّي وَجَعَلَنِي مِنَ الْمُكْرَمِين﴾یس/٢٦-٢٧.

**واتە: کابرا گوتی خۆزگە ئێستا قەومەکەم دەیانزانی کە چۆن خوای پەروەردگارم لێم خۆش بووەو چۆن منی لە ڕێزداران گێڕاوە. "خۆزگەمان بەخۆی".**

جا کە ئەو پیاوە بەڕێزە لەناویان دەرچوو ئەو کاتە نیگبەتی ڕووی لەوان کرد وتوشی ڕۆژە ڕەشی خۆیان هاتن، ئەو پیاوە بەڕێزەش پێغەمبەرﷺ ستایشیان دەکات ودەفەرمووێت:

(( رحم الله حبيبا النجار، وعظ اهله حيا وتمنى لهم الخير ميتا)).

واتە: خوارەحم بە حەبیبی نەجار بکات کە بەزیندووی ئامۆژگاری کەسوکارەکانی کرد وبەمردویش خۆزگەی خێری بۆ خواستن.

زانایانی ئایین هیچیان لە تۆ ناوێ تەنها دەیانەوێ دەستت بەرە وچاکەو خێر بگرێ، تۆش هەر پارە بۆ دەکتۆر دەژمێری ومشتو مڕ ناکەی، پێت دەڵێ: ئەو گولاجانە هەر شەش سەعات جارێك بخۆ، ئەمەش بەو جۆرە بەکاربێنە ئەو سرنجە ئەوها لێ بکە و... هتد.

تـۆش هـەر دەڵـێ ی بەسـەر چـاو پاشـان دەڵـێ ئەگـەر چاك نەبووی ئەو كاتە نوشداریت بۆ دەكـەم، تـۆش هێشتا سوپاسـگوزاری ونقـەت لـێ نـایێ تـەنها ستایـشی دەكـەی ودەڵێـی دەستەكانت خـۆش بـێ دكتـۆر گیـان بەڕاسـتی تـۆ پیاوێكی چاكی وتۆ نوشداریت خویندوه خـۆم هـیچ نـازانم هەر خۆت دەزانی.

بـەلاّم بـە داخـەوە كـە باسـی ئـایین هاتـە گـۆڕێ هـەر لەیەكەم جار لە قسەكانی مەلا یـاخی دەبـین وخـۆ ئەگـەر قسەیەكیشیان كرد بەدڵمان نەبوو یەكسەر دەكەوینـە زەم وبوختان كردنی وسوك كردنی "مەلا".

كابرایەك پێـی گوتم: حـەفت جاران ژنـی خـۆم بـەلاّق دایە! منیش پێم گوت: بەسێ یەكە كەوتووە، چوارەكەی دیكە هەڵبگرە وسوودی لـێ وەربگـرە! پاشـان كـابرا گـوتی: مامۆسـتا هـیچ چـاری نیـە؟ ولاّمـم داوە: نـا بـەخوا هـیچ چاری نیە! جا گوتی: ئەدی لە لای ئیمامی مالـك وئیمـامی



حەنەفی وهەر ئیمامێکی دیکه چ هەیه؟ "سبحان الله" ئایا ئـەو پرسـیارکاره هـیچ شـتێك لەزانـست بەکـەلکی دێ؟ دەبا خشتەیەکی ژیان بخەینه ڕوو، که چۆن ژیان بـه فیڕۆ دەچـێ وچـۆن تەمـەن دەگـوزەرێ، جـا گوتمـان: ئەگـەر کەسێك ڕۆژانـه هەشـت سـەعات بخـەوێ وئەگـەر تەمـەنی شەست ساڵ بێت ئەوه بیست ساڵی تـەواو نوسـتوه، ((واتـه بێ ئاگایه))، وه ئەگەر هەشت سـەعات بچێته ئـیش ئـەوه بیست ساڵی دیکەش لەتەمەنی چووه جا پازده ساڵیش بۆ منداڵی دانێ، ئەی پەنجا وپێنـج ساڵ چی تێماوه؟ هیچ.

هەموو ئەمانه واز لێ دێنی ودەلێی خۆ مامۆستا باسی مۆڵەت وەرگرتن وپشوەکانی نەکرد، برا گیان: تـۆ دەتـەوێ ئامۆژگـاری وەربگـری یـان دەتـەوێ ڕەخنـه بگـری!!بـەخوا ئەگەر ئەوەنده مشتومڕ بکەین لەسەر ئاپین ئەوه دڵـەکان وشك دەبن، بۆیه پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت:

(( أنــا زعــيم ببيــت في اعلــى الجنــة لمــن تــرك الجــدال، وزعيم ببيت في ربظ الجنة لمن ترك الجدال وهو مخطئ)).

**واتە: من دەستە بەری کۆشکێك بۆ ئەوکەسە دەکەم کــەوا واز لە مشتومڕ بهێنی ولەسەر حەق بێ، ودەستەبەری مسۆگەری خانەیەك دەکەم لەناو بەهەشت بۆ ئەو کەســەی کــەوا واز لــە مشتومڕ بهێنی ولەسەر هەڵە بێ.**

برایــان واز لەمــشتومڕ بهێــنن... واز لــە شــەڕە قــسە بهێنن، بێگومان ئەگەر خوا لەخەڵکێك خەشم بگرێ ئــەوە بێکاریان دەکات وتوشی مشتومڕیان دەکات.

جــا یەکــەم شــت کــە لەســەر تــەرازووی قیامــەت دەبینینــەوە ولەســەری ســزا دەدرێ وقــەت ناســڕێتەوە مەسەلەی زمان ومشتومڕی بێ سوودە، لەدنیا پارە کۆ دەکەیــەوە بەرهــەم بەدەســت دێــنی ئەمــە پارچــە زەوی مولکە ئەوە بازرگانی یە ئەوەش قازانجەکەیە...

خراپ نیە هەموو بەرەکەتە بەڵام پێویستە سوپاسی خوای لەسەر بکەی وشوکرانە بژێری دەوێ، بەوەش خوا بەزیادی دەکات:

﴿لَئِن شَكَرْتُمْ لأَزِيدَنَّكُمْ﴾ابراهيم/٢٠ .

خۆ ئەگەر لەسەر نیعمەتەکان سوپاسگوزاری خوا بکەن خواش بەرەکەتی دەخاتێ، خۆ نەمان گوتووە: واز لە دنیا بێنە، بەڵام دنیا بە قەبارەی خۆی بگرە وبیکە کێلگەیەك بۆ چاکە وخێرتێدا چاندنی.

((بەڕاستی دەوڵەمەندی سوپاسکار لەلای خوا لە هەژاری ئارام گیش چاکترە)) کەوایە زۆر جار سامان دەبێتە مایەیی لە پێ خۆ دەرچوون، بێ گومان ئەگەر هەبوونێك وات لێ بکات خوا لەبیر بکەی هیچ سوودی نیە یان سامانێك توشی لوت بەرزیت بکات بەخوا هیچ خێری تێدا نیە، ((بێجگە لە قوڕبەسەری)).

جا ئەگەر لەبەر دنیا پەرستی دوا ڕۆژت لەبیر چوو، ئەوە بەڕاستی یەکەمین بەڵگەی ئاشکرای نەخۆشی دڵەکەتە ((بەخۆت دابچۆوە)). چەند نموونەیەکت بۆ دێنمەوە تا بزانی لێ پێچینەوە و"حیساب" چۆنە؟

دامان نا ((گریمان)) تۆ دوو کوڕت هەیە (هەزار دینار بە یەکەمیان دەدەی ودووەمیان دە هەزار دیناری دەدەیتێ وبا،هەر دووکیان دەڵێ ی: ئەم بەیانیە بڕۆن هەتا ئێواریێ خەرجی بکەن ووەرنەوە، ئەوجا هەردووکیان پارەکە دەبەن خەرجی دەکەن ودێنەوە ماڵ).

ئێوارە هات وهەر دوو کوڕەکە گەڕانەوە لات، تۆش چاڵێك ئاگرت هەڵکەندوە وپڕی ئاگرت کردوە وئاسنی سوور کراوەت لەناو داناوە وئامادە کراوە، جا هەردوو کوڕەت لەسەر چاڵەکە ڕادەگری ولەیەکەمیان کە هەزاری هەبوو دەپرسی: پارەکەت بە چیدا؟ دەڵی نانم پێ خوارد وڕا دەکات ودەردەچێ چونکە گەرمیەکەی ژێر پێی زۆر

گەرمە ودەربازی دەبێ؟ جا لە گوڕی دووەم دەپرسێ کە دە هەزار دیناری برد بوو چیت لێ کرد؟ وەڵام دەداتەوە: خەرجم کرد ئەوها وئەوها وئەوها، جا دەژمێری و هەر باسی دەکات وڕاوەستانەکەی درێژە دەکێشێ لەسەر ئەو ئاگرە چاڵە گەرمە چونکە لێ پێچانەوە وحیسابەکە زۆرترە ولەبەر ئەوەی پارەکە زۆر ترە!

من ئەم نموونەم بۆت باس کرد بۆ ئەوەی کەمێك لە بابەتەکە نزیك بکەویتەوە جا ئەوهاش خاوەن سامان ودەوڵەمەند لە ڕۆژی قیامەت ڕا دەگیرێت...

(( لن تزولا قدما عبدٍ يوم القيامة حتى يسأل عن اربع: عن شبابه فيما افناه، وعن عمره فيما ابتلاه وعن مالهِ من أين اكتسبه وأين انفقهُ )).

واتە: هیچ دوو قاچێك نیە کە ڕۆژی قیامەت بڕوات تا پرسیاری چوار شتی لێ نەکرێت: پرسیاری گەنجێتی لێ دەکرێ چۆنی بەسەر برد؟ وپرسیاری تەمەنی لێ دەکرێ

چۆن تـاقی کـردەوە؟ وپرسـیاری سـامانەکەی لـێ دەکـرێ چۆن پەیدای کرد ولەچی دا چواند وخەرجی کرد؟.

سەهلی کوڕی عەبدولاَ کە زانایەك بوو چووە عێراق بۆ خوێندنی زانست شەرعی لە بەغدا ژورێکی بـەکرێ گـرت وژورێکی قوڕی چوار دیواری تەسك وتەنگ، جا کابرایەکی خزمی چوە لای وگوتی دەگەڕێمـەوە نـاو خزمـان دەتـەوێ باسی چ هەواڵێکت بۆ ببەمەوە؟

گوتی:

ڕاوەستە با شتێك ((پـەیامێك)) بـۆ دایکـم بنوسمـەوە لەگەڵ خۆت بەرە جا سەهل گوتی: چاوەرێ بکە نامەکـەی نوسی ومەرەکەبەکەی ئەو سەردەمە زۆری دەویـست هـەتا ووشك دەبۆوە، بۆیە ناچار بوو هەنـدێك خـۆڵی وشکی لـە خانوەکەی بەسەرنامەکەیدا کرد بۆ ئەوەی ووشك بێتەوە، ئەوجا پێچایەوە ودایە دەستی گوتی: ها ئـەم نامەیـە بـدە

بــە دایکــی خۆشەویــستم. هــەر هــەمان رۆژ ســەهل پێغەمبــەری ﷺ لەخەونــدا دیــت وپێــی فــەرموو: ئــەی سەهل ئەم شیرە ومستێك خۆڵ بگرە وتێکەڵیان بکەو بیان خۆرەوە. سەهل گوتی: ئەی خۆشەویست ﷺ چۆن شیر بە قور دەخورێتەوە! فەرمووی: تۆش چۆن چاکەکانت تێکەڵ بە خراپە دەکەیت، چۆن دەبێ خۆڵی ئەم خانووە کە بەکرێت گرتووە ببەی بەبێ پرسی خاوەن خانوو بیخەیتە سەر پەیامەکەت، جا وەڵامی چی دەدەیتە خاوەن خانەوەکە لە ڕۆژی قیامەت؟

جا ئەگەر مشتێك خۆڵ ئەوها بێت لە ڕۆژی قیامەت داخۆ دەبێ حالی کابرای دەوڵەمەندی ملیاردێر چۆن بێت وخۆزگە هەمووومان دەوڵەمەند دەبووین، بەڵام قیامەت لەبیرمان نەچوبایە ولێ پێچانەوەی ڕۆژە ڕەشی قیامەت نەدۆڕێنیت.

**پرسیار دەکەم :**

ئایا ئەو هەموو دۆلار ودینار ویۆرێیەت چۆن پەیدا کردوە وچۆنی خەرج دەکەی ولە چی دەیچوێنی ((وەڵامەکەت چیە پێش قیامەت لە خۆت بپرسە))، قەی ناکا پارەت خۆش دەوێ، بەڵام مافی خوای لێ دەربکە:

﴿ زُيِّنَ لِلنَّاسِ حُبُّ الشَّهَوَاتِ مِنَ النِّسَاء وَالْبَنِينَ وَالْقَنَاطِيرِ الْمُقَنطَرَةِ مِنَ الذَّهَبِ وَالْفِضَّةِ﴾ ال عمران /١٤.

**واتە: ئارەزووی ئافرەت ونەوەی نێرینە وخاوەندارێتی زیو وزێری زۆر وئەسپی ڕەسەن وهەروەها ماڵات وزەوی زار بۆ خەڵکی ڕازێندراوەتەوە. ((ت. ئاسان)).**

بەڵێ ئەمانە هەمووی خۆشی ورازاوەی دونیان، بەڵام هەندێ ئاسمان وڕێسما جیاوازی لە نێوان قارون وعبد

رەحمانی کوڕی عەوفدا هەیە، چونکە بەخشندە وچاو چنۆك زۆر لێك دوورن، ئەبو بەکریش (خوا لێی رازی بێت) پارەی هەبوو، بەڵام دەزانین چۆنی دەیبەخشی، ئەوە دەوڵەمەندە وکەسێکی بەخیلیش دەوڵەمەندە، وکوڕی عەوف چی کرد وقارونی چاو چنۆك چی بەسەر هات!!

قارون چی کرد؟ گوتی: ﴿ قَالَ إِنَّمَا أُوتِيتُهُ عَلَى عِلْمٍ عِندِي ﴾القصص/٧٧.

واتە: **گوتی من بەڕاستی خۆم ئەم سامانەم بە زانستی خۆم پەیدام کردوە.**

ئەی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ پارەکەیان چ لێکرد؟ هەموویان لە ڕێی خوا بەخشی، خۆ پێت ناڵێت واز لە دنیا بێنە چونکە خۆشەویستە، بەڵام با پارەو سامان سەرقاڵت نەکات سوپاسی خوای لەسەر بکە ئەگەر حەڵاڵ

بێت ورۆژی قیامەت لەبیر مەکە، بەداخەوە گوناهمان پێ خۆشە وتۆبەو ئیستێغفار لەبیر دەکەین ئەوەش نەخۆشی دڵەکانمانە.

لەسەر جادە دەرۆی وتەماشای ئەم وئەو دەکەی وزەمی ئەو وئەو دەکەی کە لە کۆڕێکیش دادەنیشی هیچ خوات لەبیر نیە، سەرەڕای ئەوەی کە دەچیتە ناشتنی مردووێک دەبینین خەلکی هێشتا باسی دونیا دەکەن، وەکو ئەوەیە کە ئینسان حەزی لە گوناهە، بەڕێزم ئەگەر خۆت دیت بەرامبەر ئارەزوو وحەزەکانت لاوازی ئەوا یادی تۆبە بکەو ئیستیغفار بکە، ڕۆژێك پێغەمبەر خوا ﷺ بە بیلالی فەرموو:

((یا بلال بمَ سبقتني الى الجنة؟ قد سمعتُ خشخشتك امامي فاخبرني ماذا تصنع؟)).

**واتە: ئەی بیلال بەچی پێشم کەوتی بۆ بەهەشت؟ گوێم لـە خشەخشی نەعلەکانی تۆ بوو لە پێش خۆم لـە بەهەشـت، پـێم بڵێ چی دەکەی؟.**

بیلال گوتی:

ئەی خۆشەویستی خـوا ﷺ هـەر کاتێـك دەسـت نوێـژم شوشت بێت چ لەشەو چ لە ڕۆژ ئەوا هەر دوو ڕکات نوێـژم پێکردووە وهیچ تاوانێکم نەکردووە مەگەر لە پاشی تۆبـە وئیستیغفارم لەسەر کردووە.

بـەلاّم مخـابن تۆبـەی ئێمـە پێویـستی بـە تۆبـە هەیـە وئیـــستیغفارمان ئیـــستیغفاری دەوێ، چـــونکە تۆبـــە وئیستیغفاری درۆزنانەیە، تۆبەی درۆزنان دەڵێ: "أستغفر الله العظـیم" نـەوجا چـەندان جـاری دیکـەش تەماشـای حەڕام دەکات!!! ئیستیغفارەکە درۆیە!.

بەڕاستی بۆ وەکو گاڵتەچی بەخوا وەکو ئەو منداڵەی کە باوکی پێی دەڵێ: چیدی وامەکە کوڕەکەشی دەڵێ: باوکە هیچی دی واناکەم، بەڵام پاشان باوکەکە تەماشا دەکا دیسان خراپە دووبارە دەکاتەوە، چ دەڵێ؟ "نموونەی بەرز هەر بۆ خوایە".

بەڵێ خەلکیش حەزیان لە تاوانە، گوناهیان پێ خۆشە، بەڵام دەرگای تەوبە کراوەیە، لە خوا داواکارین کە تۆبەی ڕاستەقینە لە هەمووومان وەربگرێت.

سەرنج بدە بەرهەمی تاوانەکان لە خێزان ومنداڵەکانمان دا لە خراپەی منالأن بۆ باوان ویاخی بوونی خێزان ونازاردانی جیران، هەروەها لە نەخۆشیەکانی دلأن ئێمە دروستکراوەکانمان خۆش دەوێن وخوامان لەبیر چووە، وادەزانین کە دروستکراوی خوا هۆکاری بەختەوەری ودەوڵەمەند بوونمانن یان هۆکاری بەدەست گەیشتنی پلە وپایەن بۆمان.

برای موسڵمان: ئەو خەلکە وەکو تۆ هیچیان بە دەست نیە لە هیچ شتێك نە تاڵە ناوکە خورمایەك ونە توێزاڵێك ونە چەوراتی ونە مردن ونە ژیان.

هارونە ڕەشید لە باوکی حازمی پرسی: کە لە بناری کەعبە بوو، چیت پێویستە ئەی باوکی حازم؟ فەرمووی: شەرم دەکەم لە ماڵی خوا داوای هیچ شتێك لەکەس بکەم بێجگە لە خۆی.

هارونە ڕەشید زۆر پێی سەرسام بوو، چاوەڕێی کرد هەتا ئەبو حازم لە مەککە دەرچوو بە دوایدا دەڕۆیشت، بەڵی ئەوەیە ڕێزی زانا، هارون بەو زانایەی گوت: شتێکمان داوا لێ بکە. "ئەویش شەرمی بەخۆ بوو".

وەڵامی داوە: ئەی گەورەی موسڵمانان ئەگەر لەو زاتە داوا نەکەم کە دونیای بەدەستە چۆن لەکەسێك بپارێمەوە کە دنیای بە دەست نیە.

واتە: من لە خوا دونیام داوا نەکردوە کە دونیا وئاخیرەتی بەدەستە، ئەی چۆن لە بەندەیەك بپارێمەوە کە سوود وزیانی بەدەست نیە.

بەڵێ ئەوەیە یەقینداری کە لە دڵی بەندەیەکی ئیماندار جێگیر بووە، بەڵێ خەلکت خۆش دەوێ بەلام خەلکێکت خۆش بووی کە بە خۆشەویستیەکەی لەخوا نزیك ببیەوە ولەخەلکێك دوور بکەوە کە لەخوا دوورت دەکاتەوە.

هەروەها لە نەخۆشیەکانی دلأن ئێمە کۆشك وتەلارمان خۆش دەوێت وگۆرستانمان لەبیر چووە هەتا بەرادەیەك خۆشەویستانی خۆشمان لەبیر چووە کە پێش ماوەیەکی کەم جێیان هێشتوین، تەنها هەر خەمی مێوانەکەمانە لە مێوانەکەیان دەپێچینەوە لە پارەو زەوی وسەروەت وسامانیان، بەراستی جێگەی سەر سورمانە!!

ڕۆژێك ئافرەتێك لەلای دایکە عائیشە "ڕەزای خوا لەسەر بێ" گلەی لە دڵ ڕەقی خۆی دەکرد، هەروەکو ئێمەش دڵمان ڕەق بووە، هەموو ڕۆژێك لە تەلەفزیۆنەکان دەبینین دەیان کەس لە عێراق دەکوژرێن ولە فەلەستین دەمرن بەوەش دڵمان ناسوتێ وتەقەی سەرمان دێ!! وا دەزانین نەبایە ونەباران!! جا باسی ژنەکە بابکەین گوتی: ئەی دایکی موسڵمانان گلەیی دڵ ڕقی خۆم دەکەم، دایکی موسڵمانان وەلامی داوە: زۆر یادی مردن بکە، چونکە دڵ نەرم دەکاتەوە.

یان ئەوەتا ئیمامی عەلی (خوا لێی ڕازی بێت) بە حەسەنی کوری دەگوت: ڕۆلە پەندی مردن بخوێنە، واتە باسی مەرگ بخە ناو خوێندنەکەت، بۆ ئەوەی کە لە پڕ تووشت بوو نەدۆڕێی.

بەڕاستی نەهامەتی خەلك لەوەدایە نازانن کە مردوو شۆڕکراوە ناو گۆڕەکەی چی بەسەر دێ؟ کارەساتەکە

ئەوەیە خەریکە لەبیر خۆمان دەبەین، خۆ ئەگەر یادی بکەینەوە ((من وتۆ)) ئەوە خۆزگەم نەدەخواست لەو دونیایە هەر بژیم وخزمەتی بکەم هەرگیز...

تێیدا دەژیم ودەمینێمەوە بەلاَم خوا پەرستی دەکەم وچێژ لەنیعمەتەکانی خواوە دەکەم، بەلاَم مردن لە بیر ناکەم خۆم لە گۆڕ گێل ناکەم.

لەشەڕی ئوحددا کابڕایەك شەهید کرا گوتیان: شەهادەتی پیرۆز بێ، پێغەمبەری خوا ﷺ

(( وما أدراكم؟ لو ترون ما أرى، لرأيتم قبره وقد اشتعل عليه ناراً من أجل شملةٍ قد نحلها دون وجه حق ))

واتە: **ئێوە چۆن دەزانن؟ ئەگەر ببینن ئەوەی من لە قەبرەکەی دەیبینم ئاگر لە گۆرەکەی تێی بەربووە لەسەر عەبایك ((شاڵێك)) پارچە قوماشێك کە شاردبوویەوە بە نا حەق.**

بەڵێ بەبێ ئاگاداری خۆشەویستی خوا ﷺ برد بووی هەر چەندە ئەو کەسە خەباتکاریش بوو بۆ خوا بەبێ ئیزنی سەروەرەکەی هەر لەسەر ئەوەندە گۆڕەکەی گڕی تێبەردرا.

یان کاتێك پێغەمبەر ﷺ چووە سەر دوو گۆڕەکە فەرمووی:

(( اف لك اف لك))

واتە: **ئۆف لەخۆت ئۆف لەخۆت.**

ئەوجا لقە دار خورمایەکی شکاند ولەسەر گۆڕەکەی دانا، جا لەو کاتەدا عبد لرحمانی کوڕی عەوف فەرمووی: ئەوە بۆ منە ئەی خۆشەویستی خوا ﷺ ؟

فەرمووی: نەخێر بۆ خاوەنی ئەم گۆڕەیە، ئەمەش بەسەرهاتەکەیە:

(( لهذين، يعذبان وما يعذبان من كبير، كان احدهما لا يستبرأ من بوله، وكان الاخر يمشي بالنميمة بين الناس )).

واتــە: **ئەم دووانــە ئەشــکەنجە دەدرێــن ولەســەر تــاوانی گەورەش نیە، یەکێکیان خــۆی لــە میــز نەدەپاراســت، ئــەوی تریشیان بە نەمیمی لە نێوان خەلکی هاتوچۆی دەکرد.**

بەڕاستی نەهامــەتی خــەلکی لەوەدایــە زۆربــەمان ئــەو جۆرە گوناهــە دەکــەین، دووزمــانی و خــەڵك تێــك بــەردان کارێکی ناشیرین وتاوانە وناباشە لەسەر ئەوەش بەداخــەوە ئێمە زمان درێژی غەیبەت ودووزمــانی دەکــەین هــەروەکو گاڵتە بەرانبەر پەروەردگاری بەندەکان بکەین.

"خوایە سەلامەتمان بکەیت"، برایان پێوانەکــەتان بــۆ ڕۆشن بۆوە؟

ئەگــەر دنیــات خــۆش دەوێ ودوا ڕۆژت لــەبیر چــووە، وتاوانــت پــێ خۆشــە وحــەزی لــێ دەکــەی وتۆبــەت لــەبیر چووە، وپارە وسامانت خۆش دەوێ وحیسابت لە بیر چووە

وخەلکت خۆش دەوێ وخوای خەلکت لە بیر چووە، کۆشك وتەلارت خۆش دەوێ وگۆر وگۆرستانت لە بیر چووە... ئەوجا بزانەکەوا دڵەکەت نەخۆشە ودەبێ هەر بەدوای چارەسەری دا بگەڕێی.

خۆ ئەگەر هەر ئەورۆ نوشدارەك پێت بڵێ: کاکە خوێنبەرێك لە خوێنبەرەکانی دڵت "وەستاوە" ئیش ناکات، یەکسەر توشی دڵە ڕاوکێ دەبی وسام گرتوو دەبی، وچەندان نوشدار دەگەڕێی وئەم لاو ئەو لا دەکەی هەتا دەچیە لای نوشداری پسپۆر، بۆچی؟ چونکە تەندروستیت بایەخ پێ دەدەی! کە ئەوەش بەشێکە لە دنیا. ئەی چۆن خەمی قیامەت لەبیر بکەم وچۆن دەتوانم بایەخی پێ نەدەم؟

**برای موسلمان خوشکی ئیماندار:**

ئایا دەتـوانی ڕۆژێـك خـۆت ڕابگـری وبـەدوای هۆکـاری نەخۆشی دڵەکەت دا نەگەڕێی ئەوجا بە دوای چارەسـەری دا نەگەڕێی؟؟؟ ناتوانی.

لەخوای پەروەردگار دەپارێینەوە کە
دڵە مردووەکانمان بۆ خۆی بژێنێتەوە

وصلي الله على سيدنا محمد
واله وصحبه وسلم

